زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز

٨٤

# ڕێنمایی کردنی موسڵمانان بۆ گەورەڕاگرتنی ( البلدالحرام )

## إرشاد الأنام إلى تعظيم البلد الحرام



نوسینی

شێخ عبدالرحمن بن عبدالعزيز السديس

وەرگێڕانی

مامۆستا محمد عبدالرحمن لطيف

وتارخوێنی مزگەوتی ( شێخ إبراهيم ) /كلار



زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز

( ٨٤ )

# ڕێنمایی کردنی موسڵمانان بۆ گەورەڕاگرتنی (البلد الحرام)

( إرشاد الأنام إلى تعظيم البلد الحرام )


تأليف معالي الشيخ / أ.د.عبدالرحمن بن عبدالعزيز السديس

الرئيس العام لشؤون المسجد الحرام والمسجد النبوي

وإمام وخطيب المسجد الحرام



وەرگێڕانی

مامۆستا محمد عبد الرحمن لطيف

وتارخوێنی مزگەوتی ( شێخ إبراهيم ) / کەلار



چاپی یەکەم ١٤٣٦ ك

فهرسة مكتبة الملك فهد الوطنية أثناء النشر

عنوان الكتاب : (**رێنمایی کردنی موسڵمانان بۆ گەورەڕاگرتنی (البلد الحرام)** / **إرشاد الأنام إلى تعظيم البلد الحرام**) .

المؤلف : الشيخ عبدالرحمن بن عبدالعزيز السديس حفظه الله .

المترجم : أبو فردوس محمد بن عبدالرحمن بن لطيف الكردي العراقي .

ردمك :

رقم الإيداع :

١ ــ الوعظ والإرشاد　　　　٢ ــ فضائل وآداب

**ناوی کتێب : رێنمایی کردنی موسڵمانان بۆ گەورەڕاگرتنی (البلد الحرام)** .

**ناوی نووسەر :** الشيخ عبدالرحمن بن عبدالعزيز السديس حفظه الله .

**ناوی وەرگێڕ :** محمد عبد الرحمن لطيف .

**زنجیرە : زنجیرەی ( ٨٤ ) لە ( زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز ) .**

**ژمارەی سپاردن : ژمارە ( ٥٠٣ )ی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانی پێدراوە .**

**نۆرەی چاپ : یەکەم .**

**ساڵی چاپ : ١٤٣٦ ك - ٢٠١٥ .**



**ڕێخۆشکار :**

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە یەکتایە بە سیفەتەکانی گەورەیی ، کە فەزڵیداوە بەسەر بەندەکانیدا بە خستنەسەرڕێ و نیعمەت پێبەخشین ، گەورەیی بۆ ستایش کردنی کە بە ویستی خۆی هەندێك کات و ساتی تایبەت کردووە بە چەندین فەزڵی گەورەوە ، وە هەندێك جێگا و شوێنی تایبەت کردووە بە هەندێك تایبەتمەندی بڵند و هەندێك ڕێز و گەورەیی و ئەحکام ، کە گەورەترینیان (حەرەمی حورمەتدارە) ، وە شایەتی دەدەم بەوەی کەوا هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله ، تەنهایە و بێ شەریکە ، وە شایەتیش دەدەم بەوەی کەوا (مُحَمَّد ﷺ) عەبد و نێردراوی خوایە ، وە سەروەری مرۆڤەکانە ، وە پاکترین کەسێکە کە بەسەر خاکی (أُم القُرى)دا هەنگاوی نابێت و ئەو شوێنە ڕێزدارانەی کە خواپەرستی تێدا دەکرێت گەورەڕاگرتبێت ، صەڵات و سلامی خوای لەسەر بێت و لەسەر کەسوکار و هاوەڵانیشی کە چرای تاریکی و شێری ناو قەڵاکان بوون ، وە لەسەر ئەوانەش کە بە چاکە شوێنی ئەوان کەوتوون تا ئەو کاتەی کە هەورەبرووسکە برووسکە دەدات و پەڵە هەورەکان بارانیان لێ ببارێت .

دوای ئـەوە : ئـەی برایـانی خوێنـەری ڕێـزدار : ئەمـە چـەند پەڕەیەکـە بـەروبومی لـق و چـڵەکانی پێگەیـشتووە و خـۆی ڕازاندووەتەوە بۆ هەموو کەسێکی خۆشەویست و تامەزرۆی (البلـد الـحرام) ، ئەوەش لەبەر هیچ نی‌یە ئیللا لەبەر ئەوە نەبێت کە ئەم چەند پەڕەیە قسە و باسی لە خۆگرتووە سەبارەت بە پیرۆزتـرین و پاکترین وڵات و شوێنەکان وە سەبارەت بـە جـوانترین و ڕازاوەتـرین شوێنی سەر زەوی و دونیا بە بێ جیاوازی .

لەم چەند پەڕەیەدا : بۆنی قسە و باسێك سەبارەت بە مەککەی پـیرۆز و پلەوپێگـەی بـەرزی بـە لای موسـڵمانانەوە و ئەحکامـە پایەدارەکانی و فەزڵە تایبەتە جوانەکانی هەڵدەمژین ، بەڵێ خۆمان بۆن خۆشدەکەین بە بـۆنی میـسکی قـسە و بـاس سـەبارەت بـە (أُم القُـری) کـە خـۆی ڕازاندووەتـەوە و چـاوەکانی ئەبڵەقـەکردووە بـە (مزگـەوتی حورمەتـدار / الـمـسجد الـحرام) ، وە خـۆی ڕازاندووەتـەوە بـە ئـەو شـوێنە پیرۆزانـەی کـە خواپـەرسـتی تێـدا دەکرێت (الـمشاعر الـمقدسة) .

وە ئـاواتی ناخمـان - ئـەی خۆشەویـست - لـەم چـەند سـاتە وەختەدا کە لەگەڵ سـوڕانەوە بـە نـاو فراوانـی (حـەرەمی پـیرۆزدا) بەسەری دەبەین بریتی‌یە لە : گەیشتن بە گەورەڕاگرتنی (مەککـەی پیرۆز) و ڕێزگرتن لە (مزگەوتی حورمەتـدار / الـمسجد الـحرام) و

هەستکردن بە گەورەیی ئەم شوێنە و ئامادەبوونی هەیبەتی لەسەر ئەندامەکان و ناو دڵ و ئەوەیشی کە تێیدایە لە پەنهانی و ئاشکرادا و لە فەرز و سوننەتەکانیشدا ، وە لەمەشدا ئەو کەسانە یەکسانن کە لەم شوێنە پیرۆزەدا جێگیر و نیشتەجێ دەبن چ بە شێوەیەکی هەمیشەیی بێت یان بۆ ماوەیەکی کاتی لە حاجیان و عومرەکارایان و ئەوانەش کە نیشتەجێبوون تێیدا و لە پەنایدا ماونەتەوە ، وە بە تایبەت ئێستا کە هەندێك لە خەڵك ـ خوا هیدایەتیان بدات ـ سەبارەت بە حوکمە شەرعیەکانی (حەرەم) لە بەرەولادانەدان و سەبارەت بە ئادابەکانی مانەوە لە پەنایدا و چاکێتی ئەو ئادابانەشدا لە پشت هەڵکردندان ، ئەمە لە کاتێکدایە کە ئوممەتی ئیسلامی بریندارمان لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستی بە شانازی کردنە بە پیرۆزیەکانی و شتە جێگیرەکانی وە بە جێگای سەروەری و شانازیەکانی ، وە دەستگرتن بە هەردوو وەحیی ڕێنماییکار بۆ پلە بڵندیەکانی دونیا و قیامەت .

برای موسڵمانم : خوای پاك و پایەدار (مەککەی پیرۆز)ی لە ناو تێکڕای شوێنەکان تایبەت کردووە و ڕێزی لێناوە بە گەورەترین ئەحکام و فەزڵەکان ، وەکو چۆن ـ گەورەیی بۆ ناوی ـ هەندێك لە مانگ و ڕۆژەکانی ڕێزلێناوە ، وە هەندێك لە شەو و ساتەوەختەکانی فەزڵداوە بەسەر ئەوانەی تردا بە ڕەحمەت و

بەرەکەتی خۆی - پاکی و پایەداری بۆ خوا - ، تەنها ئەوە بڕیاردەدات لە ناو دروستکراوەکانیدا چۆن بیەوێت ، وە بە فەزڵی خۆی هەندێك کەس و کات و شوێن هەڵدەبژێرێت بە ویستی خۆی ، وە خوا دانا و وردزانە .

## * ڕێزدارترین و باشترین شوێن :

وە لەو شوێنانەی کە خوای گەورە لە ناو شوێنە پیرۆز و پاك و گەورەڕاگیراوەکاندا هەڵیبژاردووە بریتی‌یە لە : (أُم القُرى) و (البلد الحرام) و (البلد الأمين) کە باشترین و گەورەترین شوێنە بە ڕەهایی و بە یەکڕایی موسڵمانان ، مەککەی سەربەرزی و یەکخواپەرستی و ڕۆچوون لە چاکەکاریدا ، ناوجەرگەیەك کە خوا ڕێزی لێناوە لە قورئانێکدا کە تاوەکو ڕۆژی بەیەکترگەیشتنەوە دەخوێنرێتەوە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۝٧﴾ [الشورى] واتە : ئێمە قورئان بۆ تۆ ناردووە بۆ ئەوەی کە خەڵکی (مەککە / أُم القُرى) و ئەوانەیش کە بە چواردەوریدان ئاگادار بکەیتەوە .

وە فەرموویەتی : ﴿إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا ۝٩١﴾ [النمل] .

واتە : بەڕاستی من فەرمانم پێکراوە بەوەی کەوا تەنها پەروەردگاری

ئەم وڵاتە بپەرستم کە حورمەتی لێناوە و ئەمانی پێبەخشیوە و هەندێك کرداری تێدا حەرام کردووە .

وە گومانی تێدا نی یە کەوا زۆری ناوەکان بەڵگەیە لەسەر ڕێزی ناولێنراوەکە :

واعلمْ بأنَّ كثرة الأسامي دلالة أنَّ الـمُسمَّى سامي

واتە : بزانە کەوا زۆری ناوەکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ناولێنراوەکە بەرز و بڵندە .

وە لەو ڕێزە جێگیرانەی ئەوەیە : کە خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا لە دوو شوێندا سوێندی پێخواردووە ، خوای پاك و پایەدار فەرموویەتی : ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ۝١﴾ [البلد] واتە : نەخێر ، سوێند بەم وڵاتە (کە مەککەیە) ، وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ۝٣﴾ [التين] واتە : وە سوێند دەخۆم بە ئەم وڵاتە ئامن و سەقامگیرە .

برای موسڵمانم : دەبێت گومانت چۆن بێت بە خاك و زەوییەك کە باشترین زەوی خوایە و خۆشەویسترین زەویە بە لای خوا و بە لای پێغەمبەرەکەیشیەوە (ﷺ) ، بە هەست و بیستنی دڵی ئامادەتەوە گوێبیستی ئەم فەرموودە بەندکار و سوێندە سەرسوڕهێنەر و وتە سازگار و ناسکە ببە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ ، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّهِ إِلَى اللَّهِ

، وَلَوْلاَ أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ)) [أخرجه الإمام أحمد بـرقم : (١٨٧١٥) والإمام الترمذي برقم : (٣٩٢٥)] .

**واتــە : ســوێند بــە خــوا تــۆ باشــترین زەوی خوایــت ، وە خۆشەویسترین زەوی خوایت بە لای خواوە ، وە ئەگەر لەبەر ئـەوە نەبێت لە ناو تۆدا دەرکرام ئەوا دەرنەدەچووم لێت .**

*** ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا ﴾ واتـە : ئـەوە نـیـە ئێمـە (حەرەم)ـمان کردووەتە شوێنێکی ئەمن و ئاسایش بەرقەرار :**

**وە مەککەی ئیمان و تەقوا و هیدایەت و رووناکی ـ بەردەوام بـە پاراسـتنی خـوا چـواردەوردراوە و بـە ئیسلامیـشەوە رووناکراوە ـ وڵاتێکـی حورمەتـدار و قەدەغـەکراو و ئـەمن و ئاسـایش بەرقـەرارە تاوەکو ڕۆژی قیامەت ، خـوای گـەورە دەفـەرموویت : ﴿ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا (٩٧) ﴾ [آل عمـــران] واتــە : وە هــەر کەسـێك بـچێتە نـاو مەککەوە ئەوا ئامن و ئارامە و ترسی لەسەر نییە .**

**ئیمامی** (الطبري) **ڕەحمەتی خوای لێبێت لە تەفسیرەکەیدا** (٥ / ٦٠٢) **فەرموویـەتی :** (هذا أمرٌ كان في الجاهلية ، كان الحرمُ مَفــزَعُ كل خائف وملجأ كل جَانٍ ، لأنه لــم يكن يُهاج به ذو جريرة ، ولا يَعرِض الرجل فيه لقاتل أبيه وابنه بسوء ، قالوا : وكذلك هو في الإسلام ، لأن الإسلام زادَه تعظيمًا وتكريــماً) .

واتـە : ئەمـە شـتێکە لـە سـەردەمی نەفامیـشدا وابـووە ، کـە (حەرەم) جێگای داڵدەدانی هەموو کەسێکی خاوەن تـرس بـووە و هانابـەری هـەموو کەسێکی تاوانکـار بـووە ، چـونکە لـەوێ کەسـی خاوەن تاوان جێلەق نەکراوە بۆ ئەوەی هەڵبێت و بڕوات ، وە هـیچ پیاوێك تێیدا بە خراپەوە نەدەڕۆیشە سەر ڕێی ئەو کەسەی باوکی یـان کوڕەکـەیی کوشـتبوو ، وە لـە ئیسلامیـشدا بـەو شـێوە بـووە چونکە ئیسلام (حەرەم)ی زیاتر گەورەڕاگرتووتر و ڕێزدارتر کرد .

وە خوای پاك و پایەدار فەرموویەتی : ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ﴿٦٧﴾ ﴾ [العنكبوت] .

واتە : ئەوە نییە ئێمە (حەرەم)ـمان کردووەتە شوێنێکی ئەمن و ئاسـایش بەرقـەرار لـە کاتێکـدا کـە خـەڵك لـە چـواردەوریاندا دەفڕێنرێن و بە دزیەوە دەبرێن و دەکوژرێن و تاڵان دەکرێن .

برای خوێنەری بەڕێز :

بواری ئەمن و ئارامی تەنها کورت هەڵنـەهاتووە لەسـەر مرۆڤـ ، بەڵکو مرۆڤـی تێپەڕاندووە بـۆ گیـانلەبـەران و ڕووەك و دانەوێڵـە و درەخت و بێگیانەکانیش ، هـەردوو پێـشەوا (بوخـاری و مـسلم) لـە فەرموودەی (ابن عباس)ـەوە (رضي الله عنهما) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا فەرموویەتی : ((إِنَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ ، فَهْوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ

الْقِيَامَةِ ، وَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيهِ لأَحَدٍ قَبْلِي ، وَلَمْ يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، لاَ يُعْضَدُ شَوْكُهُ ، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهُ ، وَلاَ يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَهَا ، وَلاَ يُخْتَلَى خَلاَهُ)) [أخرجه البخاري برقم : (٣١٨٩) ، ومسلم برقم : (١٣٥٣)] .

واتە : خوای گەورە لەو ڕۆژدا كە ئاسمانەكان و زەوی تێدا دروست كردووە ئەم وڵاتەی حورمەت لێناوە و هەندێك كرداری تێدا حەرام و قەدەغە كردووە ، بۆیە ئەم وڵاتە بە حورمەت لێنانی خوا حورمەت لێنراوە تاوەكو ڕۆژی قیامەت ، وە كوشتاركردنی تێدا حەڵاڵ نەكراوە بۆ هیچ كەسێك لە پێش من ، وە بۆ منیش حەڵاڵ نەكرا تەنها بۆ ساتە وەختێك لە ڕۆژدا نەبێت ، بۆیە ئەم وڵاتە حورمەت لێنراوە تاوەكو ڕۆژی قیامەت بە حورمەت لێنانی خوا ، لەبەر ئەمە : درەختی دڕكاویی ناقرتێنرێت ، وە نێچیری ناورووژێنرێت بۆ ڕاوكردنی ، وە شتی وون بوویی هەڵناگیرێت ئیللا بۆ كەسێك نەبێت كە بیناسێنێت و بانگەوازی بۆ بكات ، وە نابێت پووش و گیایشی ببڕێت .

وە حورمەت و هەروەها ئەمن و ئاسایشی ئەم وڵاتە جێگیر و بەردەوامە لە سەردەمی (إبراهيم و إسماعيل)ەوە (عليهما السلام) تا ئەو كاتەی كە خوا زەوی و ئەوەشی كە لەسەریەتی بۆ دەمێنێتەوە و كۆتایی بە هەموو شتەكان دێت ، وە خوایش باشترینی ئەو

کەسانەیە کە لە پاش نەمانی کەسانی تر شتیان بۆ دەمێنێتەوە .

وە خوای پاك و بەرز و پایەدار ئەم وڵاتەی پاراستووە لە هەموو کەسانێکی یاخی و لە سنووردەرچوو ، وە سەرسەخت ترین کەسی دەستدرێژکەری لـێ ڕەت کردووەتـەوە و بەرپەرچـی داوەتـەوە ، خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ۝١﴾ [الفيل] .

واتە : ئایا سەیر ناکـەیت پـەروەردگارت چـی کـرد بـە کەسانی خاوەن فیلەکان و چی بەسەریاندا هێنا ؟

هەر بۆیە ئیسلام لە پەنایدا سـەروەر و باڵادەست و بـەربڵاوە ، وە تەوحید و یەکخواپەرستی لە ژێر ئاسمانیـدا پـارێزراو و جـێگیر و دامەزراوە ، وە خـشوع و ملکەچـی بـۆ خـوایش لـە گۆڕەپانەکانیـدا بێسنوورە .

وە ئەم ئەمن و ئاسایشە کـە پرشـنگی بـەربڵاوە و کاریگـەری و درەوشانەوەکەی گشتگیرە تەنها تایبەتە بە (البلد الـــــحرام)ـەوە جگە لە تێکڕای زەوی ، وە بـە هـیچ شـێوەیك لـێی هـەڵناگیرێت و کەم نابێتەوە .

چۆن ئەمە دەبێت ؟ لە کاتێکدا کـە ئەمـە ئـەمن و ئاسایـشێکی خوایی و دەستەوەستانکەرە بۆ هەموو ئەو هەوڵانەی مرۆڤـ کرد بـۆ بـەدیهێنانی ناوچـەیەکی حورمـەت لێنـراوی ئـامن و ئـارام ، کـە

لەپێناویدا چەك فڕێ بدرێت ، وە کەسانی خاوەن کێشە و ناکۆکی تێیدا ئامن بن ، وە خوێنی تێدا ڕاگیراو و پارێزراو بێت ، وە هەموو کەسێکی ئاسوودەییخواز هانای بۆ لا بەرێت ، وە هەموو کەسێکی ترساو و تۆقاوی تێدا ئاسایش بێت .

پوختەی وتە ئەوەیە - بەردەوام موەفەق بیت - کە ئەم وڵاتە حورمەت لێنراوە (البلد الحرام) و ئەوەشی کە لە خۆیی گرتووە لە تایبەتمەندییە گەورەکان شتێکی دەگمەن و بێوێنەیە ، وە باسکردنی ڕێزی و بەربڵاوی پرشنگداری و ئەمن و ئاسایشی بەردەوامە بە بەردەوامی گێڕانەوەی پەندەکان لەسەر زارەکان .

*** ﴿ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ ﴾ : یەکەمین ماڵی خواپەرستی کە دانراوە بۆ خەڵك :**

برای موسڵمانم : لەوەی کە باش وایە بەڕێی بکەین بۆ نێو زانستی ڕێزدارتان ئەوەیە کە مەککەی پیرۆز : نیوەندی بوونەوەرە ، وە مەنارەیەکی پرشنگدارە بەسەر نێوچاوانی مێژووەوە ، وە جڵەوگیری ژیانی نێو ئەم ئوممەتەیە ، لەم شوێنەدا یەکەمین ماڵی خواپەرستی دانراوە بۆ خەڵك ، کەعبەی گەورەڕاگیراو ، قیبلەی ڕوولێکراو ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾ [آل عمران] .

واتە : بەڕاستی یەکەمین ماڵی خواپەرستی کە دانراوە بۆ خەڵك ئەوەیە کە مەککەدایە .. ماڵێکی پیرۆزە و مایەی هیدایەت و بەرچاوڕۆشنییە بۆ هەموو جیهانیان .

واتە : دانراوە بۆ پەرستنی خوا ، وە جێی بۆ لا گەڕاوەیە بۆ پەرستشی خواپەرستان ، وە تەوافی تەوافکاران ، بە مەبەستی گەورەڕاگرتنی خوا ، وە خوای پاك و بەرز و پایەدار مننەت دەکات بەسەر عەبدەکانیدا بەم فەزڵە گەورەیە و فەرموویەتی : ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَـٰمًا لِّلنَّاسِ ﴿٩٧﴾ ﴾ [المائدة] .

واتە : خوای گەورە کەعبە و ماڵی حورمەتداری کردووەتە جێی ڕاگرتنی دین و ژینی خەڵك .

وە فەرموویەتی : ﴿ فِيهِ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ ﴿٩٧﴾ ﴾ [آل عمران] .

واتە : ماڵی خوا چەندین نیشانەی گەورەیی و باڵادەستی و زانایی و دانایی و پەروەردگاری خوای تێدایە .

زانایانی خاوەن تەفسیر دەڵێن : لەوانە : (بەردە ڕەشەکە) ، وە لەوانە : (جێ پێی پێغەمبەر إبراهیم عليه السلام) ، وە لەوانە : (دیواری کەعبە) و پاراستنیان بە درێژەی زەمانە ، هەموو ئەمانە دەرس و پەند و وریاکەرەوەن لە لایەن خواوە ، وە لەمەوە هەیبەتی ئەم ماڵە کەوتووەتە نێو دڵەکانەوە ، وە ناخی مرۆڤەکاندا

لـه پەنایـدا ئـارام و ئاسـوودە دەبێـت ، وە گـەرمترین فرمێـسك دەڕێژرێت لەسەر ئەو چواردەورە پاکە و ئەو پانتاییە دڵفرێنە .

یَروق لي منظرُ البيتِ العتيقِ إذا بدا لطرفـــي في الإصباح والطَّفَلِ

كأنَّ حُلَّته السوداء قد نسجت مِنْ حبَّة القلب أو من أَسوَدِ الـــمُقَلِ

واتـە : دیمـەنی مـاڵی دێرینی خـوا کاتێـك دەردەکەوێتـە پـێش چـاوم لـە بەرەبەیانـدا ، وەکـو بڵـێی پۆشـاکە ڕەشـەکەی لـە ناوکوڕەکەی دڵ یان لە ڕەشایی بیلبیلە چاو دووراوەتەوە .

الله أكبر ! بەڕاستی کەعبەی پیرۆز بینەر کە دەیبینێت یەکسەر ناخی ئاسوودە دەبێت بە خشوع و ئـارامی و خۆشـحاڵی و شـادی ، وە لە خۆشـی و کامەرانیـدا دڵـی دەفڕێـت ، وە فێنکـی دڵنیـایی لـە نێـوان ئـەم لاولایـدا دەگریـسێتەوە ، وە ئاواتـەخوازە کـەوا چـاوی لەسەر نـەتووروکێنێت ، وە دەسـتی خۆشـی لـە زانـای زۆرزان (ابن القـیم) ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت وتەکـەی چـەند جوانـە لـەو بەیتـە هەیبەتدارەدا :

إذا عاينتْـــهُ العـــينُ زالَ ظلامـــها وزال عن القلبِ الكئيب التألـــمُّ

فلا يعرف الطَّرف الـــمعاين حُسنه إلى أن يعود الطَّرف والشوق أعظمُ

فمِنْ أجلِ ذا كـــلُّ القلوبِ تُحبُّـــه وتـــخضع إجـــلالاً لـــه وتُعَظِّـــمُ

واتـە : کاتێـك کـە چـاو کەعبـەی پـیرۆز دەبینێـت تـاریکی و تارماییەکەی نامێنێت ... وە ئازاری دڵی غەمباریش نامێنێت .

ئەو چاوەی کە دەیبینێت لەگەڵ ئەوەی کە بە جوانی کەعبەی زانی دووبارە چاوی ناتوورکێنێتەوە ئیللا تامەزرۆ بوونی بۆی گەورەتر دەبێت .

لەبەر ئەوە هەموو دڵەکان خۆشیان دەوێت ... وە ملکەچن لەبەر گەورەیی ڕاگرتنی .

ئەی خوایە دەبێت ئەم ناوچە پیرۆزە چەندین خۆشەویستی هەبێت کە بەربەرەکانێ دەکات لەگەڵ تامەزرۆیی پێگەیشتنی و گرفتاری بوونی بۆی ، وە بەربەرەکانێ دەکات لەگەڵ نیازی گرتێبەربووی بۆی ، کە لە پێناوی پێگەیشتنی چەندین ماڵ و سامانی خەرج کردووە ، وە هەموو ئەوەی کە دەگمەن بێت لە ناخیدا بەخت کردووە بۆ ئەوەی کە ڕۆحی دابگرێتەوە بە بۆنی لێخۆشبوون ، وە بۆ ئەوەی کە شنەبای ڕەزامەندی هەڵمژێت ، وە بۆ ئەوەی کە نێوچاوانی تەڕ بکات بە گوڵاوی لەخواترسان و هیدایەت .

برای حاجی و برای عومرەکارم : ئەی ئەو کەسەی کە ڕووت کردووە لە ئەم ناوچە پیرۆزە و چاوەڕێی داباریینی بارانی ڕەحمەت و میهرەبانیت بۆ ئەوەی لە کانگای تاعەتەکاندا تێر بخۆیتەوە :

بەڕاستی قەڵەم لە ئاست بە جێگەیاندنی حەقی ئەم ناوچە پیرۆزەدا کوول دەبێت ، وە مەککە لەوە گەورەترە کە وەسف بکرێت ، وە هەستەکانی گەورەیی لە ئاستیدا گران و کەمە .

**برای موسڵمانم :**

مەککەی پیرۆز بریتی‌یە لە : قیبلەی موسڵمانان بە زیندوو و مردوویانەوە ، وە ئارامگەی دڵی ئیماندارانە ، وە جێی دابەزینی وەحیی پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ، وە لە شوێنە دیاریکراوەکانیدا پایەیەك لە پایەکانی ئاینی تێدا بەجێدەهێنرێت ، وە لانکەی پەیامی درەوشاوەی ئیسلامە ، وە کانگە و سەرچاوەی ڕووناکی و ڕۆشناییە ، وە مێژوویەکی پڕە بە زانایان و هەڵکەوتوان و خواناسان و چاکەکاران .

ئەی خۆشەویست : (أُمُّ القُرى) بە درێژەی سەردەمەکان - وە بەردەوامیش بە ویستی خوا - بینایەکی بەرز و بڵندە ، وە باڵاخانەیەکی توندوتۆڵ و دامەزراوە ، دەوڵاتانی تر دەڕوخێن و شارستانی‌یەکان وەکو گەڵای وشك لە ساتەوەختی پایزدا هەڵدەوەرێن و دەکەون ، بەڵام مەککە بە نهێنی‌یەکانی و دەرس و پەندەکانیەوە پارێزراو دەبێت بە پاراستی خوا بۆی ، وە مەشخەڵێکە بۆ ئیمان و برایەتی ، وە خوانێکە بۆ عقیدە و بیروباوەڕ ، وە کانگایەکی هەڵقوڵێوە بە دەعوە و بانگەواز و دانامرکێتەوە ، وە هەرچەندە لە ناو جەرگەی دۆڵێکی وشکانی بێ کشتوکاڵیدا جێگیر بووە بەڵام گەورەترین شارستانی ئیسلامی مرۆڤایەتی بەرهەم هێناوە و لە نێو جەرگەی ئەم ناوچەیەدا

هەڵقوڵاوە ، ئەوە بوو قەڵاکانی بتپەرستی تێکوپێکدا بە یەکدا ، وە ئوممەتانی زیندوو کردەوە ، وە کووره خامۆشەکانی گیرساندەوە ، وە ژیانی نەفامی و ئەفسانە داهێنراوەکانی بە هێزی ئیسلام سڕیەوە .

ئەی خوێنەرانی بێوێنە :

خوای گەورە و پایەدار گۆڕپانەکانی (البلد الحرام) وڵاتی حورمەتداری کردووەتە جێی خواپەرستی عەبدەکانی ، وە پێویستی کردووە لەسەریان لە هەموو ڕێگاوبانێکی دوورەوە و لە هەموو بەرزایی و تەنگەبەرێکەوە بێن بۆ لای ، وە ئەم ڕووتێکردنەیش بووەتە هۆی سڕینەوەی خراپەکان و لابەری هەڵە و تاوانەکان ، وە خوای پاك و پایەدار بە هیچ پاداشتێك ڕازی نەبووە بۆیان کە پاداشتیانی پێبداتەوە جگە لە بەهەشت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ أُسْبُوعاً يُحْصِيه ، كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ حَسَنَةٌ ، وَكُفِّرَ عَنْهُ سَيِّئَةٌ ، وَرُفِعَتْ لَهُ دَرَجَةٌ ، وَكَانَ عَدْلَ عِتْقِ رَقَبَةٍ)) [حديث حسن : أخرجه الإمام أحمد برقم : (٥٧٠١) والإمام الترمذي برقم : (٩٥٩)] .

واتە : هەرکەسێك حەوت جار بژمێرێت و تەواف بکات بە دەوری ئەمماڵەدا ئەوا بە هەر هەنگاوێك چاکە و حەسەنەیەکی بۆ دەنووسرێت و خراپە و تاوانێکی لەسەر دەسڕێتەوە و پلە و

دەرەجەیەك بەرز دەكرێتەوە و ئەو حەوت جار تەوافەیش بەرامبەر ئازاد كردنی كۆیلەیەكە .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((لَيْسَ لِلْحَجَّةِ الْمَبْرُورَةِ ثَوَابٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ)) [أخرجه الترمذي برقم : (٨١٠)] .

واتە : حەجی وەرگیراو هیچ پاداشتێكی نیيە جگە لە بەهەشت .

*** وڵاتــی حورمەتــدار : تـایبەتمەنــدی و فــەزڵ و گــەورەیی و ئەحكامەكانی :**

برای موسڵمانم :

ئەم شوێنە پیرۆز و خاكە پاكە هەندێك تایبەتمەندی هەیە كە تایبەتە پێیەوە و هەندێك فـەزڵ و گـەورەیی و ئـەحكامی هەیـە كـە پـێی جیاكراوەتەوە لە شوێنەكانی تر ، لەوانە :

**١ ـ پێنج نوێژە فەرزەكان تێیدا چەند قات دەكرێتەوە هەر نوێژێك بەرامبەر بە سەد هەزار نوێژ :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَـذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ ، وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ صَلاَةٍ)) [رواه الإمام أحمد برقم : (١٤١٩)] .

واتە : تەنها نوێژێك لە نێو مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) باشترە لە هەزار نوێژی نێو مزگەوتەكانی تر جگە لە مزگەوتی حەرەم نەبێت ، وە تەنها نوێژێك لە نێو مزگەوتی حەرەمدا باشترە لـە سـەد هـەزار نوێژی نێو مزگەوتەكانی تری جگە لە خۆی .

٢ ـ نوێـژی سوننەتی ڕەها كـە هۆكـاری نـیـە لـە پێنج كاتـە ڕێگـری لـێكراوەكەدا تێیـدا مـەكروهـ نـیـە ، لەبـەر فەرمایـشتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) : ((يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ : لاَ تَمْنَعُوا أَحَدًا طَـافَ

بِهَذَا الْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ)) [رواه الإمام أحمد : (٤ / ٨٠) والإمام الطبري : (١٦ / ٨٠٥)] .

واتە : ئەی نەوەی (عَبْد مَنَاف) : ڕێگری لە هیچ کەسێك نەکەن کە بە دەوری ئەم ماڵدا تەواف و نوێژ بکات لە هەر ساتە وەختێکی شەو یان ڕۆژدا بیەوێت .

٣ ـ ئەگەر مرۆڤ نیازی خراپە و تاوانێك بکات لە وڵاتی حورمەت لێنراوەدا (البلد الحرام) ئەوا لێی دەگیرێت و بەرپرسیار دەبێت لەسەری ئەگەر چی دووریش بێت لێیەوە ، لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ ﴾ [الحج] .

واتە : وە هەر کەسێك نیازی لادان و ستەم کردنی تێدا هەبێت ئەوا سزای بە ئێش و ئازاری پێ دەچێژین .

وە لە (شُعْبَة)وە فەرموویەتی : "لَوْ أَنَّ رَجُلاً هَمَّ فِيهِ بِإِلْحَادٍ وَهُوَ بِعَدَنِ أَبْيَنَ ، لأَذَاقَهُ اللَّهُ عَذَاباً أَلِيماً" [رواه الإمام أحمد برقم : (٤٠٧١) والإمام الطبري برقم : (٩٠٧٨)] .

واتە : ئەگەر پیاوێك نیازی لادان لە شەرع و کردنی تاوانێکی هەبێت تێیدا ئەوا خوا سزای بە ئێش و ئازاری پێ دەچێژێت ئەگەر چی لە شاری (عەدەن)ی دووریش بێت .

وە ڕووی تایبەتمەندێتی مەککە بە ئەم حوکمەوە بریتی‌یە لەوەی

کە وڵاتانی تری جگە لە مەککە ئەگەر مرۆڤ نیازی کردنی تاوانێکی هەبێت تێیدا ئەوا لێی ناگیرێت و بەرپرسیار نابێت لەسەری مەگەر بیکاتە کردەوە .

٤ ـ پێویستە هەموو ساڵێك کۆمەڵێك لە خەڵك رووی تێبکەن بۆ بەجێهێنانی پایەیەك لە پایەکانی ئیسلاك کە بریتییە لە حەج .

٥ ـ نوێژی جەژن تێیدا لە ناو (مزگەوتی حورمەتدار / المسجد الحرام)دا ئەنجام دەدرێت نەك لە دەشتایی هەر وەکو چۆن لە تێکڕای وڵاتانی تردا وایە .

٦ ـ نابێت بۆ کەسێك کە دەیەوێت حەج و عومرە بکات بڕواتە ناو (البلد الحرام) وڵاتی حورمەت لێنراوەوە ئیللا بە ئیحرامەوە نەبێت .

٧ ـ دەججال پێی ناخاتە ناو ئەم وڵاتەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ)) [أخرجه الإمام البخاري برقم : (١٨٨١)] .

واتە : هیچ وڵاتێك نییە ئیللا دەججال پێی تێدەخات و دەڕواتە ناوەیەوە ئیللا مەککە و مەدینە نەبێت .

٩ ـ تایبەتمەندێتی ئەم وڵاتە بە سەربڕینی ئاژەڵی (هەدیەوە / دیاری حەرەم) تێیدا ، وە لە هیچ شوێنێکی تر جگە لە ئێرە دروست نییە .

٩ ـ ئەوانەی کە پێچەوانەی ئاینی ئیسلامن هاتنە ژوورەوەیان بۆ ناو حەرەم لێ‌قەدەغە دەکرێت ، لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ ﴿٢٨﴾﴾ [التوبة] .

واتە : بەڕاستی موشریکەکان پیسن و بۆیە نابێت نزیکی (مزگەوتی حورمەتدار / المسجد الحرام) ببنەوە .

١٠ ـ حەڵاڵ نییە لە مەککەدا چەك هەڵبگیرێت بێ ئەوەی پێویست بێت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((لاَ يَحِلُّ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَحْمِلَ بِمَكَّةَ السِّلاَحَ)) [أخرجه الإمام مسلم برقم : (١٣٥٦)] .

واتە : حەڵاڵ نییە بۆ یەکێك لە ئێوە لە مەککەدا چەك هەڵبگیرێت .

١١ ـ حەرامێتی بڕینی درەخت و پوشی تەڕی ، وە نابێت نێچیری بوورژێنرێت و ڕاوبکرێت ، وە شتی وونبوویشی هەڵناگیرێت ئیللا بۆ کەسێك نەبێت کە بیناسێنێت و بانگەوازی بۆ بکات .

١٢ ـ تایبەتمەندبوونی بە ئاوی موبارك و پیرۆزی زەمزەم و ئەوەی کە لە بارەیەوە هاتووە سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی لە پاداشت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِنَّهَا مُبَارَكَةٌ ، إِنَّهَا طَعَامُ طُعْمٍ)) [أخرجه الإمام مسلم برقم : (١٣٥٦)] .

واتە : بەڕاستی بیری زەمزەم ئاوەکەی موبارك و پیرۆزە و خواردنیشە بۆ خواردن .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ)) [أخرجه الإمام أحمد : (٣ / ٣٥٧)] .

واتە : ئاوی زەمزەم بۆ ئەو مەبەستەیە کە بۆی دەخورێتەوە .

١٢ ـ تایبەتمەندبوونی ئەم وڵاتە و خەڵکەکەشی بە دوعاکەی (إبراهیم)ی هەرەخۆشەویستی خوا (عليه السلام) لە فەرمایشتی خوای گەورەدا : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا ﴿٣٥﴾ ﴾ [إبراهيم] .

واتە : وە (إبراهیم) وتی : ئەی پەروەردگارم ئەو وڵاتە ئامن و ئارام و بەرقەرار بکە .

وە لە فەرمایشتی خوای گەورەدا : ﴿فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ [إبراهيم] .

واتە : خوایە کەسانێك ئاشنا بکە بە خەڵکی ئەم وڵاتە کە ئارەزووی هاتن بۆ لایان بکەن و رزق و رۆزیان بدە لە بەروبوومەکان بەڵکو شوکر و سوپاست بکەن .

*** حاڵی سەلەف لە ئاست گەورەڕاگرتنی وڵاتی جێئەنجامدانی دروشمەکانی خوای گەورە :**

حــەجیان و عومرەکــارانی خۆشەویــستم .. ســەردانکاران و دراوسـێیانی ئـەم وڵاتـە پـیرۆزە : ئـەم وڵاتـە ئـەمین و ئارامـە ـ کـە خوای بەدیهێنەر ئێوەی تایبەت کردووە بـە نیشتەجێبوون تێیـدا و چاکەی لەگەڵتاندا کردووە بەوەی کە بۆی هاتوون ـ خوای بـە توانـا و خاوەن هێز ـ پیرۆزی بۆ ناوەکانی ـ چواردەورەریداوە بـە قەڵایـەکی بەرز و جێگیر لە هەڕەشەکردن لەوانەی کە مەبەستی خراپـی پـێی هەبێت یان نیازی خراپەیەکی تێیدا هـەبێت یـان تـاوان و هەڵەیـەکی تێـدا بکـات ، بۆیـە وتەیـەکی کاریگـەری فـەرمووە کـە ناخـەکان هەڵدەکەنێت و دڵە ڕەقەکان لـەت و شـەق دەکـات و ئـەوەتا خـوای پاک و پایـەدار فەرموویـەتی : ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾﴾ [الــحج] .

واتـە : هەر کەسێك نیازی لادان و ستەم کردنی تێدا هەبێت ئـەوا سزای بە ئێش و ئازاری پێ دەچێژین .

ئەم دەستەواژە کاریگەرە ئەو پەڕی وریاکردنەوە و سەرزەنشت کردنی تێدایە بۆ تەنها نیازکردن و ویستی لادان و خراپـە و تـاوان و ستـەم کـردن ، چ جـای بـۆ کەسـێك کـە کـردووە خراپەکـە بکـات و تێوەگلێت ، سوێند بە خوا ئەوە خراپتر و قورستر و گەورەترە !

برای موسڵمانم : پەنات دەدەم بە خوا لەوەی کە نزیك ببیتەوە لەمە چ جای تێی بکەوێت ، خوا موەفەقت بکات و بتخاتە سەر حەق و ڕاستی .

**ئەی خوێنەری خۆشەویست :**

وەکو بڵێی واهەست دەکەم کە تۆ تامەزرۆی گێڕانەوەی هەندێك هەڵوێست و پەندی نەوەی یەکەم و پێشینیت ، کە بۆنخۆشکراون بەگەورەڕاگرتنی ئەم وڵاتە حورمەتدار و جێی خواپەرستییە گەورانە ، ئەوەیە دەیخەمە بەرچاوت - خوا ژیری و هۆشمەندیت پێ ببەخشێت - حاڵی خەڵکانێك کە ئیمان لە ناو دڵیاندا کۆبووەتەوە و گەورەڕاگرتنی ڕواندووە و کەمتەرخەمی و کەموکوڕی لابردووە ، ئەوەیە دڵانێك کە لە پەنای خوادا ناسك و نەرم بووە ، وە لە ئاست حەرام کراوەکانی و جێی تووڕەبوونەکانی ڕای کردووە و خۆی بەدوور گرتووە .

لە (عومەر)ی کوڕی (خەتتاب)ەوە (ﷺ) فەرموویەتی : ((لأن أُخطئ سبعين خطيئة بِرَكْبَة ـــ موضعٌ بالـحجاز ـــ أحبُّ إلـيَّ مِنْ أن أُخطئ خطيئة واحدة بـمكة)) [المصنَّف لعبدالرزاق : (٥ / ٢٨] .

واتە : ئەگەر لە ناوچەی ڕەکبە - شوێنێکە لە وڵاتی حیجاز - حەفتا تاوان بکەم پێم خۆشترە لەوەی کە لە ناو مەککەدا یەك تاوان بکەم .

وعن عبد الله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنه) : ((كان له فسطاطان : أحدهما في الحل والآخر في الحرم ، فإذا أراد أن يعاتب أهله عاتبهم في الحل ، فسئل عن ذلك ؟ فقال : كنا نُحدَّثُ أن من الالحاد فيه : أن يقول الرجل : كلا والله ، وبلى والله)) [تفسير الطبري : (١٦ / ٥١٠)] .

**واتە : (عبد الله)ی کوڕی (عەمر)ی کوڕی (عاص) (رضي الله عنه) دوو خیمەی هەبوو : یەکێکیان لە دەرەوەی حەرەم و ئەوەی تریان لە ناو حەرەم ، جا ئەگەر بیویستایەت گلەیی بکات لە خێزان و کەسوکاری ئەوا لە دەرەوەی حەرەم گلەیی لێیان دەکرد ، وە سەبارەت بەمە پرسیاری لێکرا ؟ ئەویش فەرمووی : ئێمە بۆمانیان دەگێڕایەوە کەوا بەشێك لە لادان و تاوان لە حەرەمدا ئەوەیە کە پیاوێك بڵێت : نەخێر بە خوا ، وە بەڵێ بە خوا .**

**وە لە (مجاهد)ەوە فەرموویەتی :** ((إذا دخلت الحرم فلا تدفعن أحدا ، ولا تؤذين ، ولا تزاحم)) ، قال أبو جعفر : يريد بقوله : (لا ترفع الأصوات ، تعظيما لمكة) [أخبار مكة للفاكهي : (٢ / ٢٥٩)] .

**واتە : ئەگەر ڕۆیشتیتە ناو حەرەمەوە ئەوا پاڵ بە کەسەوە مەنێ ، وە ئەزیەتی کەس مەدە ، وە قەرەباڵغیش دروست مەکە .**

**مەبەستی بەم قسەیە ئەوەیە : دەنگ بەرز مەکەرەوە لەبەر گەورەڕاگرتنی مەککە .**

**وە لە** (طلق)**ی کوڕی** (حبیب)**ەوە (عومەری)ی کوڕی (خەتتاب) فەرموویەتی :** ((یا أهل مكة : اللّهَ اللّهَ في حرم الله)) [أخبار مكة للفاكهي : (٢ / ٢٦٦)] .

**واتە : ئەی خەڵکی مەککە : توخوا توخوا ئاگاتان لە حەرەمی خوا بێت .**

**وە لە** (عبد الرحمن)**ی کوڕی** (القاسم)**ی کوڕی** (حسن القاص)**ەوە لە باوکیەوە فەرموویەتی :** ((كان عمر بن عبد العزيز ﷺ إذا قدم مكة كأنه على الرضف ــ الحجارة المُحْماة على النار ــ حتى يخرج)) [أخبار مكة للفاكهي : (٢ / ٣٠٨)] .

**واتە : کاتێك کە** (عمر بن عبد العزيز ﷺ) **دەهاتە ناو مەککەوە تاوەکو دەڕۆیشتە دەرەوە وەکو ئەوە وابوو کە لەسەر بەردی داخکراو بێت .**

**وە هەندێکیان فەرموویانە :** ((إنَّ احتكار الطعام وظلم الخادم إلحادٌ في الحرم)) [المصنف لعبدالرزاق : (٥ / ١٥١)] .

**واتە : قۆرخ کردن و لەخۆگرتنی خواردن و زوڵم و ستەم کردن لە خزمەتکار بەشێکن لە لادان لە ناو حەرەمدا .**

**خوایە دەبێت چەندێك هەبێت لە خەڵك کە بە لێزمە گەورەڕاگری ئەم حەرەمە حورمەتدارەبن ، وە چەندێك هەبێت لە خەڵك کە تامەزرۆی ڕێزلێنانی ئەم وڵاتە حورمەتدارەبن ، سوێند بە**

خوا ئەوە نیشانەی چاکێتی و سەرفرازی‌یە و نیشانەی لەخواترسان و سوودمەندبوونە لە پەنهانی و پێش چاوی خەڵکیشدا ، خوای پاك و پایەدار فەرموویەتی : ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾ [الحج] .

واتە : هەر کەسێ دروشمەکانی ئاینی خوا گەورە ڕاگرێت ئەوە بەڵگەی دڵ ترسانە لە خوای گەورە .

خێر و فەڕدار و موبارەك بێت ئەو کەسەی کە ڕاهاتووە لەسەر لەخواترسان و دامەزران لە نێوەندی ئەم وڵاتە پاك و پیرۆزەدا ، وە بەختەوەری بۆ ئەو کەسەی کە جێگیربووە لەسەر گەورەڕاگرتنی و دامەزراوە لەسەری .

ئەی خۆشەویستی تامەزرۆ : ـ کە لە ئاست تامەزرۆیت گلەییت بەدیار نامێنێت ـ ئایا ئێمە هاوڕانین لەسەر جوانی و بەرزی ئەم ئەدەب و ئاکارە لەگەڵ وڵاتی حورمەتداری خوادا ؟ دەبێت ئەم ئاکارە نەرمونیانە چەند بەرز بێت لە ئاست ماڵی دێرینی خوادا ! !

وە لە شتە سەلمێنراو و بنەمایی و یەکلابووەکان کە گۆڕانی بەسەردا نایەت ئەوەیە کە : پیرۆزی هەردوو حەرەمی ڕێزدار عەقیدە و بیروباوەڕێکی ڕۆچووە و جێگیرە ، وە پرسێکی هەمیشەیی دامەزراوە ، ڕووداوەکانی ساڵان و سەدەکان گۆڕانکاری و ڕاگواستنی بەسەردا ناهێنێت ، بۆیە شایستەیە بۆ ئەهلی ئیسلام

کە سوور و دامەزراو بن لەسەر بەجێهێنان و پارێزگاری کردن لەسەر پیرۆزی ئەم وڵاتە و دانی پێوەبگرن ، بە تایبەت لەسەردەمی فیتنە و ئاشووبە لەناوبەرکان و دونیاویستی‌یە فەوتێنەرەکاندا کە پایەکانی روحی هەڵوەشاندووەتەوە و قەڵای بابەتە ئیمانی‌یەکانی رووخاندووە یان نزیکە لەوەوە .

برای خۆشەویست :

بەڕاستی ئەم پێنووسە - کە خۆشەویستی مەککەی پیرۆز دەنووسێتەوە - ناتوانێت بەدەم خواستەکانەوە بێت و خۆی دەگرێتەوە لە کورتبڕی سەبارەت بە مەککە کە بریتی‌یە لە : روبارەکانی پاك و خاوێنی و گانگەی هەڵقوڵانی رووناکی زەوی و ئاسمان ، بەڵام هەندە بەسە سەبارەت بە ئەم زانیاریانە لەباری مەککەوە بەوەی کە لە پێشەوە باسکرا لە باسە بۆنەدارە میسك چەشنەکان .

داوای : کردەوەی پاك و گەیشتن بە پاداشت و ئاوات لە خوا دەکەم ، وە پاکی و پیرۆزی بۆ مەککە - وە هەرکەسێك شتێکی خۆشبوێت ئەوا زۆر باسی دەکات - و بۆ ئەوانەش کە ڕێزی لێدەگرن و بەگەورەی ڕادەگرن و بۆ ئەوانەش کە خەڵکی مەککەن و بۆ ئەوانەش کە دراوسێیەتی و سەردانی مەککە دەکەن .

* ﴿ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴾ : **هەر کەسێ دروشمەکانی ئاینی خوا بە گەورەیی ڕاگرێت ئەوە بەڵگەی دڵ ترسانە لە خوای گەورە :**

برای خوێنەرم ـ خوا موەفەقت بکات ـ دەتگەڕێنمەوە بۆ سەر بابەتێکی زۆر گەورە ـ کە ڕێخۆشکاریم بۆی کردووە بە ئەدەب و حاڵی سەلەف سەبارەت بە گەورەڕاگرتنی حورمەتەکانی ئەم پانتاییە پیرۆزە ـ کە ئەویش بریتی‌یە لە : ئەدەب و حاڵی ئێمە لەگەڵ ئەم وڵاتە حورمەتدارەدا کە پاکترین و خۆشترین بۆن دەبەخشێت بە روحی هەموو موسڵمانێك ، وە بە دەنگێکی نزم و باڵێکی نەرمەوە ، دەوترێت : زۆر بە داخ و خەمەوە خەڵکانێك ئەدەبیان خراپە لەگەڵ خوادا و لەگەڵ حەرەمی پیرۆزیدا و لەگەڵ عەبدە بێتواناکانیدا ! !

ئایا ئەوە لە ئەدەبە کە عەبد خۆی پیس بکات بە پۆخڵەواتی بیدعە و ئەفسانە و ئەوەی کە پێچەوانەی بیروباوەڕی پاك و ڕاستە لە وەحیی دابەزێنراودا یان هەڵە و تاوان و سەرپێچی بکات ؟! !

وە ئایا ئەوە لە ئەدەب و چاکێتی دراوسێ‌یەتی‌یە کە نوێژەکان بفەوتێنرێت و کەمتەرخەمی بکرێت لە تاعەت و خواپەرستی‌یەکاندا و پلە و پێگەی پەرتەوازە بکرێت ؟! !

وە ئایا ئەوە لە ئەدەب و دینداری و گەورەڕاگرتنی حەرەمی حورمەتدارە کە موسڵمان بکەوێتە ناو زیناکردن و مامەڵەکردن بە ریبا یان دەستبردن بۆ مادە مەستکەر و هۆشبەرەکان ؟!! لەکاتێکدا کە لە ڕێزدارترین شوێن و پیرۆزترین وڵاتدا نیشتەجێبووە ! سوێند بە خوا ئەمە جێی داخە بۆ کەسێك ئەو تاوانانە بکات یان بێت بە ناخیدا ؟!

ئایا ئەوە لە چاکێتی دراوسێیەتی و شوکرانەبژێری نیعمەتە تەواوەکانی خوایە کە جوێن بدرێت و قسەی نابەجێ بوترێت و غەیبەت و فیتنەیی و قسەهێنان و بردن و بوختیان و زوڵم و ستەم و غەش و ساختەکاری بکرێت ؟!! یان ئامێرەکانی هەست بزواندن ئاشکرا بکرێت و زیادەڕەوی بکرێت لە ڕابواردنەکان و خۆرووت کردنەوەی ئافرەتان و خۆدەرخستنیان ! یان بەرەڵاکردنی چاو بۆ سەیرکردنی ئافرەتە موسڵمانە بێئاگاکان لە تاوان و خراپە و ئەوەی کە هەندێك لە کەسانی گێل و گەمژە دەیکەن لە کەم شەرمی لە حەرەمی خوادا و هەوڵی تێکشکاندنی قەڵا ئامنەکانی دەدەن ؟!

ئایا ئەوە بەشێکە لە گەورەڕاگرتنی ئەم حەرەمە پیرۆزە کەوا باوکان و دایکان دەستبەرداری منداڵەکانیان ببن بۆ ڕابواردن و یاری

کـردن لـه پانتـایی و گۆڕەپانەکانیـدا بـه بـێ ڕێگـری لـێکردن و سەرزەنشت کردنیان ؟

پـاکی و بێگـەردنی بـۆ تـۆ خوایـه .. ئەمـه چـاونەترسـیـیەکی مەتریسیدارە !!

**برای موسڵمانم .. برای حاجیم .. برای عومرەکارم :**

ئـەوە چ نیعمەتێکـه خـوا بـه تـۆی بەخـشیوە کـه ئاواتەکـەتی بەدیهێناوە و تۆی گەیاندووە بە داواکاریەکـەت و پێنـت ناوەتـه نـاو خاکی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و صـەحابه بـەڕێزەکان ، وە چاوەکانت لەبەر گەورەیی ئەم ماڵه دێرینه فرمێسك دەڕێـژێت و ئومێدی لێبووردن و لێخۆشبوونی خوا دەکەیت ، وە بە چاوی خۆت چەندین بـەزەیی پێداهاتنـەوەی پـەروەردگارت و هەسـتی روحییـت بینیوە کە پێشتر شتی وات نەبینیوە .

بۆیە لەبەر خاتری خوای گەورە داوات لـێدەکەم ـ وە ئەمـەیش لە ئاست کەسـانی نیـشتەجێ و دراوسـێی ئـەم وڵاتـەدا گەورەیـە ـ کەوا ئاگات لە حورمەتی ئەم شوێنە بێت و بایـەخی پێبـدەیت ، وە گەورەی ڕابگرێت حەقی گەورەیی ڕاگرتن ، وە حورمەت و هەیبەتی ئەم شوێنە بخەیتە نێـو چـاوانتەوە ، وە ئایا لـە پاداشـتی چـاکەدا تـــەنها چـــاکه نـــیـــه : ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ  ﴾ [الرحمن] .

داواکارم خوا پشتیوانیت بکات و ئاگای لێت بێت ، وە ئەم فەرمایشتەی خوا ڕاست و حەقت بەس بێت : ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ﴿٣٠﴾ ﴾ [الحج] .

واتە : هەرکەسێك حورمەتەکانی خوا گەورەڕابگرێت ئەوە باشترە بۆی لای پەروەردگاری .

**وە لە کۆتاییدا :**

وتەیەکی بە ئینصافانە بۆ حەقیقەت و مێژوو پێشکەش دەکەین بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم وڵاتەیان بنیات ناوەتەوە بە ڕێکوپێکی و بە نیازێکی پاکەوە خزمەتیان کردووە و ماڵیان لە خزمەتیدا بەخشیوە بە بێ مننەت کردن و داوایان لێ‌کراوە و ڕەزیلیان لێ نەکردووە ..

دەڵێین : خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە بە باشترین پاداشت لە ئاست هەردوو حەرەمی ڕێزداردا لەبەرامبەر ئاوەدانکردنەوە و پێشخستن و خزمەت کردن و پاك و خاوێن کردنەوەیان .. وە لەبەرامبەر ئەو پەڕی خزمەت کردنتان و بەخشینی ئەو پەڕی هەوڵ و تواناتان ـ وەکو ئاسانکاری بۆ ئەو کەسانەی کە ڕووی تێ‌دەکەن ـ تەواترین بەش و گەورەترین پاداشتتان بۆ بنووسێت ، لەگەڵ ئەوەی کە لێتانەوە چاوەڕێ

دەکرێت لە بەخشینی زیاتر ، داواکارم لە خوای بەرز و بە توانا بە فەزڵ و بەخششی خۆی زیاتر موەفەق و چاکتان بکات .

وە لاکردنەوەیەکی ڕێزدارانە تۆمار و باس دەکەین ، وە درەوشانەی دەربڕینی پاڕانەوەیەك تۆمار دەکرێت بۆ هەر کەسێك کە گرنگی و بایەخ دەدات بە گەورەڕاگرتنی (البلد الحرام) خوای گەورە موفەقیان بکات بۆ هەر شتێك نیازی دەکەن .

ئایە ئەوە چ پرۆژەیەکی ئیسلامی شارستانی گەورەیە کە شایستەی هاندان و بایەخ پێدان و پیاهەڵدان و گرنگی پێدان و ئاگالێبوونە ، وە پێویستە هەموو خۆشەویستێکی ئەم وڵاتە پیرۆزە شانازی پێوە ، بکات خوا بەرەکەتی بڕێژێت بەسەرتاندا و ناوکرۆکەی حەق ببێکن و وەڵامی بانگخوازەکەی خوا بدەنەوە :

﴿ وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ ﴾ [الحج] .

واتە : ئەم ماڵەم پاك و خاوێن بکەنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە تەواف دەکەن و لە نوێژدا ڕادەوەستن و کوڕنوش و سوجدە دەبەن .

هەروەها لە خوا دەپاڕێمەوە ـ گەورەیی بۆ ناوی ـ کە شوکرانەبژێری نیعمەتە زۆرەکانیمان پێببەخشێت ، وە ئەمن و ئەمان و ڕۆشنی و ئارامی بەردەوام بکات بەسەر هەردوو حەرەمی ڕێزدار و ئەوانەیش کە ڕوویان تێدەکەن ، وە چاکێتی دراوسێیەتی ئەم دوو شوێنەمان بە نسیب بکات ، وە ئەدەبمان وەکو ئەدەبی ئیسلام بێت ، وە بە تایبەت

لە چوارچێوەی ئەم وڵاتە حورمەتدارەدا ، وە حاجیان و عومرەکاران و سەردانکارانی موەفەق بکات بۆ تێگەیشتن و شارەزابوون لە دین و ئاین ، وە بۆ ئاگابوون لە حورمەتی ئەم وڵاتە ئەمینەدا ، وە خوایش لە پشت مەبەستەوەیە و تەنها ئەوە ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست .

وە کۆتایی دوعامان ئەوەیە کە بڵێین : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ، وە صەڵات و سەلام و بەرەکەتی خوایش لەسەر پێغەمبەرمان موحەممەد بێت ، وە لەسەر کەسوکارە پاکەکانی و صەحابە چاکەکانیشی کە جوانترین نموونەیان پێشکەش کردووە سەبارەت بە گەورەڕاگرتنی ئەم وڵاتە ، وە لەسەر ئەوانەیش کە بە چاکە شوێنیان کەوتوون بە ئەندازەی پەرۆشی دڵی حاجیان و ڕووتێکاران و عومرەکاران بۆ ماڵی خوای گەورە .

**الْحَمْدُ للهِ الذِّي وَفَّقَنِي لِتَرْجَمَةِ**

**هَذهِ الرِّسَالَةِ الصَّغِيْرةِ الْحَجْمِ .. الْعَظِيْمَةِ النَّفْعِ وَالْفَائِدَةِ**

**(لَقَدْ بَدَأْتُ بِتَرْجَمَتِهَا مِنْ بَلْدَتِي كَلار ، وانْتَهَيْتُ مِنْهَا فِي مَكَّةَ الْمُكَرَّمَةِ**

**أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٦ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّةِ)**

مَكَّةَ الْمُكَرَّمَة / بِدَاخِلِ الْمَسْجِدِ الْحَرَام / أَمَامَ الْكَعْبَةِ الْمُشَرَّفَة

بَعْدَ صَلاةِ الْفَجْر / ٧ / جَمَادي الآخرة / ١٤٣٦ هـ

وَقَبْلَهَا وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ رِسَالَةِ : **(الْإِسلامُ مِنْهَاجُ الْحَـيَاة)**

لِسَمَاحَةِ الشَّيْخ عَبْدِالعَزِيْزِ آلِ الشَّيْخ حَفظَهُ اللّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٦ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

وَقَبْلَهَا أَيْضاً وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ رِسَالَة : **(زَادُ الدَّاعِيَةِ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ)**

لِفَضِلَةِ الإِمَامِ الشَّيْخ مُحَمَّد بْنِ صَالِح الْعُثَيْمِيْن رَحِمَهُ اللّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٥ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

وَقَبْلَهَا أَيْضاً وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ رِسَالَةِ : **(تَفْسِيْرُ سُوْرَةِ الْفَاتِحَة)**

لِمَعَالِي الشَّيْخ صَالِح بْنِ فُوزَان الفُوزَان حَفظَهُ اللّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٤ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

وَقَبْلَهَا أَيْضاً وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ رِسَالَةِ : **(الدُّرُوسُ الْـمُهِمَّةُ لِعَامَّـةِ الأُمَّـة)**

لِسَمَاحَةِ الشَّيْخ عَبْدِالعَزِيْزِ بْنِ بَاز رَحِمَهُ اللّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ حَجٍّ عَامِ ١٤٣٣ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

اللّهُمَّ ارْزُقْنِي الاتْيَانَ إِلَى الْحَجِّ وَالْعُمْرَةَ مَرَّات عَدِيْدَة

وَارْزُقْنِي الإِقَامَةَ فِي مَكَّةَ الْمُكَرَّمَة وَالْمَدِيْنَةِ النَّبَوِيَّة

ــ قُولُوا : آمِيْن ــ

**أبو فردوس محمد بن عبدالرحمن الكردي العراقي**